لەسەر ئەرکی «زمناکۆ» چاپ کراوە

# بنچینە کۆمەڵایەتی یەکانی ئافرەتی لادێ نشینی کوردەواری



برهان قانع

نەورۆزی/ ١٩٧٩

لەسەر ئەرکی « زمناکۆ » چاپ کراوە

# بنچینە کۆمەڵایەتی یەکانی
# ئافرەتی لادێ نشینی کوردەواری




نەورۆزی/١٩٧٩

پێشکەشە بە :

# ئەو کەسانەی بەهای سەربەستی ناشارنەوە

برهان قانع

چاپخانەی ئیرشاد - لە بەغدا
١٩٧٩

لـه کوردەواری ئێمـەدا ، ئافرەت وەکو مرۆڤێك کـار ئـەکات‌و ئەچەوسێتەوەو تێکەڵ بـە هـەموو ئێش‌و ئازارە کۆمەڵایەتیەکان ئەبێ ، بەڵام وەکو مرۆڤێك خاوەنی راو سەربەستی‌و دیاری کردنی سەرەنجامی ژیانی خۆی نی‌یە[1] •

لە وڵاتی ئێمەدا   بە تایبەتی لە لادێ کاندا ـ هێشتا دیاردەی ئەو بنچینە کۆمەڵایەتیا نەی کە ئافرەتی کوردی پابەندی پاشماوەی رێژیمی دەرەبەگایەتی لەناوچوو ماڵـە باوان کردوە ، ماوەتەوە •• سـەربەستی ئافرەت لـە وڵاتی ئێمەدا ـ لە لادێکانا بـە تایبـەتی ـ هەندیك رووی جیاوازی هەیە لەگەل ئەو سەربەستی‌یەدا کە ئافرەتی شاری هەیانە •• ئافرەتی لادێ نشین هـەرچەند توانای دیاریکردنی سـەرەنجامی ژیان‌و دوارۆژی خۆی نیەو ناتوانێ بە ئارەزووی خۆی‌و بە ئاشکرا هاوڕێی ژیان‌و ماڵ‌و مێرد بۆ خۆی دیاری بکات[2] ، بـەڵام لـە ئیش‌و کارو

---

**(١) لە گۆڤاری ژمارە ٤٥ ی (بەیان)ی کانونی یەکەمی ١٩٧٧ دا کورتەی ئەم نامیلکەیەم وەکو باسێك بلاو کردەوە ، بەلام لەبـەر نەبوونی جێگا هەندێکی لێ لابرا بوو •**

**(٢) تا ئیستاش لە لادێکانی کوردستاندا ئافرەت توانای دیاری کردنی دەسگیرانی نیە ••**

رێـگاو بانو دەشـتو دەر کـردنو بـەرگ پۆشیندا لـەناو سنووری کۆمەڵایەتیی خێڵـەکیانەی ئەو ناوچـەیەدا کـە تیایا ئەژی تاڕادەیەك سەربەستیی هەیە •

گیروگرفتی دواکەوتنی ئافرەتی لادێ نشین لە وڵاتی کوردەواری ئەمڕۆماندا لە رووی رۆشنبیریو[1] کۆمـەڵایەتیو سیاسیو ئابوریـەوە نیشانەیەکی ترسناکە لەبەردەم رێبازی راپەڕینی هاوچەرخانەی سەرجەمی کۆمەڵداو کار ئەکاتە سەر هەموو لایەنە کۆمەڵایەتیو ئابوریو سیاسییەکانی ناو کۆمەڵو دوایان ئەخات••چونکە دۆخی پاشکەوتنو بە پاشکەوتوویی مانەوەی ئافرەت زیان بە مەسەلەی پێشکەوتنی کۆمەڵ ئەگەیەنێ ، ئینجا هەر لەبەر ئەمەیـە پێویستە ئافرەت لـە هـەمو بارو دۆخێکدا لـەروی تیوریو پراکتیكو مافەوە سەربەست بکرێ بۆ ئەوەی گۆڕانێکی ریشەیی نەناخی کۆمەڵدا بەرپا بێت •

بیروباوەڕی دواخستنو بە دواکەوتوویی مانەوەی ئافرەت لە هەر کۆمـەڵێکدا رێبـازێکی زیـان بـەخشانـەو پێچـەوانـەی بیرو باوەڕی شۆڕشگێریو دیموکراتیانەیە •

پێویستە ئافرەت[2] ببێتە پارسەنگو لایـەنێکی گرنگی مـەسەلەی ئەو رزگار بوونە گشتییەی تێکڕای کۆمەڵ لە رووی سیاسیو ئابووریو رۆشنبیریو کۆمەڵایەتییەوە •

ئافرەتی کوردەواری ئەمڕۆمان هێشتا زوربەیان پابەندی پاشماوەی ئەو رێبازە فیکریو نەریتە کۆمەڵایەتییـە کۆنو دواکەوتووانەن کـە دوورن لە گیانی نەتـەوە پەرستییو کار کردنی سەربـەستانەو بـەجێ هێنانی پێداویستییە گرنگەکانی گۆڕانکاری کۆمەڵەوە •

---

(١) ئافرەتی کوردی لادێ نشین تەنیا رۆشنبیری خێڵەکیانەی هەیە
(٢) لێرەدا ئافرەت بە شێوەی گشتیی ئەگرێتەوە ••

ئافرەت ، هەرچۆن بێو لەهەر لایەك بێ بەشێکی گرنگی ئەو کۆمەڵەیەو لێی جیا ناکرێتەوەو تێکەڵ بە ژانو ئازارو هەموو جۆرە جموجووڵێکی ژیانیەتی •

ئافرەتی لادێ نشین ، تا ئێستاش لە زۆر ناوچەدا گیرۆدەی مەینەتی نەخوێندەواریو نەریتی کۆمەلایەتی ماڵەباوانو مێردو خەزورانو ، زنجیرە ئەرکێکی دەسکردی پاشماوەی یاسای نیمچە کۆلۆنی لەناو چووە ••

هەرچەند ئافرەت لە بواری نیشتمانیو نەتەوایەتیدا نەیتوانیوە رۆڵی کاریگەرانەی خۆی وەکو [بەشێك] یان نیوەی کۆمەڵ بگێرێ ئەمەش هۆی ئەو دەست بەسەرا گرتنە فیکرییەیە کە بە میراتی بۆی بەجێ ماوە ••

دەرەبەگایەتی لە هەموو قۆناغێکداو هەمیشە هەوڵی زەوت کردنی سەربەستی ئافرەتو بە دواکەوتوویی مانەوەی داوە ، بۆ ئەوەی ئافرەت هەمیشە وەکو کەرەسەیەکی بازرگانی مامەڵەی پێوە بکرێو ببێتە هۆیەکی بنچینەیی بۆ دەرامەتو دەسکەوتی رۆژانەی •

ئافرەتی کورد لە دو لاوە دوچاری چەوسانەوە بوە ، یەکەم : باری ئەو ریژیمە کۆمەلایەتیەی تیایا ئەژی ••دوەم نەریتی ماڵە باوانو ماڵە مێرد ••

هەرچەند باری شارستانێتی ئەمرۆمان ، تا ئێستا نەیتوانیوە لە هەموو روویەکەوە مەسەلەی سەربەستی ئافرەت بخاتە روو[1] ، لایەنەکانی ژیانی بکاتە هەوێنی پێشکەوتنو ژیانی نوێ ، بەلام بە پێی دۆخی رۆژگارو ئەو گۆڕانکارییە قووڵەی کە بە هۆی تەکنیکەوە لە ژیانی ئادەمیزادی هاو چەرخدا رووی داوە ئەمیش تا ڕادەیەك هەنگاوی ناوەو

---

**(١) شارستانێتی ئەمرۆمان تارادەیەك پابەندی ریژیمی کۆمەلایەتی خێلەکیانەیە لە هەندێك بواردا •••**

ئەهمیەتی مێژوویی خۆی لـە بواری کۆمەڵایـەتی‌دا پاراستووەو دەوری پێشکەوتنی [بە پێی تواناى خۆی] لە کۆمەڵدا گێراوە ..

تەنیا ئیش کردن‌و هاریکاری کردن لـە مـەسەلـەی ئابووری‌داو بەرهـەم هێنـان رواڵـەتی تـەواوی سـەربەستی‌ی ئافـرەت نادات بـە دەستەوە .. لەبەر ئەوە پێویستە ئافرەت بە کردەوە بەشداری ئەو ئەرکە شۆرشگێڕیانە بکات کە بوونەتە کۆڵەکەی راگرتنی کۆمەڵ‌و پێشکەوتن‌و پەرەسەندنی باری ئابووری وڵات[1] .. وە لە بواری سیاسەتیشدا ئەبێ خۆی خاوەنی خۆی بێ . ئەوەندەی لە لادێ‌دا ژیاوم‌و شارەزای باری ژیان‌و کۆمەڵایەتی ئافرەتی لادێ بوم باسی ئەکەم .

لەم نامیلکەیەدا بە کورتی باری ژیانی کۆمەڵایـەتی ئافرەتی لادێ لە رۆژگاری پابـەندی ریژیمی دەرەبەگایەتی‌یەوە تا ئـەمڕۆ کـە بـە شارستانیەتێکی رووکەش لە بواری مەسەلەی ئافرەت‌دا بەرچاو ئەکەوێ بەپێی توانا ئەخەینە روو . وە سەرەتای باسەکەمان لەگـەل سـەرەتای لەدایك بوونی ئافرەت‌و دەوری رۆژانەی لە ژیاندا دێنین :

## لە دایك بوون :

نەك تەنیا لە لادێ کاندا ، بگرە لـە زوربـەی شارەکانیش داو ، تەنانەت لە بنەماڵە ـ بەناو پێشکەوتووە کانیش ـ دا[2] ، ئەو بایەخەی پێ نادرێ کە لە کاتی لە دایك بوونی [کوڕ] دا پێ‌ی ئەدرێ ..وەکو کوڕ شەوارەی بۆ ناگیرێ‌و گوێزە بانەی بۆ ناکرێ‌و ئاهـەنگی ناو نانی نیەو تەنانەت بێشکەو لانکی وەکو کوڕ بۆ نارازێندرێتەوە .

زۆر جار بووە لە کوردەواری‌دا ئافرەتێك لـە کاتی مناڵ بووندا

(١) لێرەدا ئافرەتی شاریش ئەگرێتەوە ..
(٢) مەبەست لە هەندێك بنەماڵەیە کـە خۆیان بە پێشکەوتو دائەنێن بەلام لە بواری مەسەلەی ئافرەتدا پابەندی نەریتە دواکەوتووەکانن.

که زۆر ماندوو شەکەت بووە ، ئەگەر کچی بووبێت مەلۆتکەکەیان لێ شاردۆتەوەو بە بیانووی ناوك برینو چەرا[1] کردنەوە لێیان دور خستۆتەوە بۆ ئەوەی پێ نەزانێ کچی بووەو ،لەو کاتە پڕ لە ماندویەتیەدا خەفەتی زیادی پێ بخواو لەسەر خۆی بچێ ،کاربکاتە سەر دەروونیو بێ ئالۆژێنێ ٠٠وە یان بورێتەوە ،وە پێیان وتووە شوکور کوڕت بووە ٠٠وە یان زۆر جار کە بە باوکی منالەکەیان وتووە [کچتان بوو] ، نەختێك راماوەو تەنانەت ئەم مەسەلەیانە بە دەم ئەو جۆرە باوکانەوە گێڕاوەتەوە کە وتوویانە [بریا ئەو شەوە لە ئاش بوومایە][2]

هەتا ئەمڕۆش کوردەواری ئێمە لە زۆر شوێنیا پاشماوەی ئەو چاوەڕووانی‌یە میراتی‌یە ماوەتەوە کە چاوەڕووانی کوڕ ئەکەنو کچیان بە بیردا نایەت ٠

## جلو بەرگ :

زۆر جار تا کچەکە گەورە ئەبێو ئەبێتە دەستە هەرزەکارو تواناى ئیش کردنی دەرو دەشتی ئەبێ هەر جلە کۆنەی خێزانەکەیان لەبەر ئەکات ، کە نەختێك هات بە خۆدا ئینجا بایەخ بە جلو بەرگی ئەدرێو شان بەشانی کوڕ تەنیا لە بواری پۆشاك دا جیاوازی‌یەکی ئەو تۆی نابێ[3] ، هەندێك شت تا ئەم رۆژگارەی دواییەشو بگرە لە هەندێك شوێنو ناوچەدا ئیستاش بۆ ئافرەتی لادێکان وەکو شوورەیی

**(1) چەرا ، یان گۆش کردن ٠٠ یەکەمین ژەمی ئەو خۆراکە شیرەیە کە ئەی درێتی ٠٠**

**(2) ئەم پەندە لە کوردەواریدا باوە هەر کەسێك لە منالی خۆی رازی نەبێ وا ئەڵێ ، واتا ئەگەر لە ئاش بوومایەو لە مالەوە نەبوومایە ئەم منالە نەئەخولقا ٠٠ ئەمە نیشانەی پەشیمانی‌یە لە منالەکە ٠ وەئافرەتیان بە وەجاخ دانەئەنا ٠٠**

**(3) کچ تا شووی ئەکرد قۆچکەی لەسەر ئەنا ، ئەمە نیشانە بوو بۆ کچان ، پاش شوو کردنیان ئینجا دەسمالیان ئەدا بەسەردا ٠٠**



**- روکاری هەڵپەڕکێیەکی ئافرەتان بە بەرگی کوردییەوە -**

وابو ، بۆ نموونە : کەرەسەی ئارایشت ، کراسی ناسك ، سەعات کردنە دەست ، جۆرە پێلاوێکی مودێل تازە ،[1] ... بەڵام بە بێ خۆ داپۆشین و روو پۆش جل و بەرگیان لەبەر ئەکرد ، وە تەنانەت دورینی هەندێك پارچەی جلی ئافرەتان لای پیاوان شورەیی بوو[2] ..

---

**(١) تا ئەم رۆژگارەی دواییش کچان کراسی جاوی شینیان بە زۆری لەبەر ئەکرد ..**

**(٢) درونی ئاوەل کراس ، یان بڵێین ژێرکراسی ئافرەتانە لای پیاوان بە شورەیی ئەزانرا ئافرەتان خۆیان بە دەست درووو ئەم پارچانەیان ئەدوری ..**

## یاری کردن :

لە لادێ دا زوربەی یاری یـەکانی منالاّن هەر بۆ کوڕانـە ، کچ هەر لە تەمەنی دە سالاّنەیەوە هێڵێك بە نێوانی کوڕو کچدا ئەکێشرێو ئیتر کچ توانای دەرچوونی لەو هێڵە نیە ، کاتێك گەیشتە ئەو تەمەنە لە هەموو ئەو یاری یانە دورە پەرێز ئەوەستێ کـە کوڕان ئەیکەنو هـەر ئێوارەی لێ هات وەکو شێوە بەندی یـەك ئـەبێ بچێتـەوە ماڵەوە نـە گوێی ئاگردانەکەیانا بە ئیشو کاری ناو ماڵـەوە خـەریك بێ ، خۆ ئەگەر ئیشی بە ماڵە دراوسێ یەك هەبوو ، ئەوا ئـەبێ منالێکی [نێرینە]



**ـ کۆمەڵێك ئافرەت لەسەر جۆگایەك خەریکی حاجەت شۆرینن ـ**

---

واتا کوڕ لەگەڵیا بڕواتو بێتەوە ٠٠ یاری کردنی کچان لە ماوەیەکی زۆر کەمدا سەر هەڵ ئەداو دائەمرکێتەوە ، ئەویش بە پەنجەی دەست ئەژمێردرێن ٠٠ ئەو یاری یانەی کە گرانەو ئـەرکی جووڵانەوەو دور

کەوتنەوەی تیایە وەکو کێلـە بەردینە ، سێ‌باز ، غارغارێن[1] ، یاری ڕاکردن ، شتی قورس هەڵدانو •••• بـە تەبیعەت کچـان خۆیانی لێ ئەشارنەوە ••



ـ کۆمەڵێك ئافرەت لەسەر چاوگەی ئاوێك ـ

---

تا ئیستا مەگەر بە دەگمەن ئەگەرنا نەبووە کچێك بەشداری یاری کوڕانە بکات[2] ، یان بیەوێ وەکو کوڕان بچی بۆ ڕاوو دەرو دەشتو ئەم لاو ئەولاو کاروانی شارو بەرە بکاتو بە ئارەزووی خۆی بچێ بۆ سەیرانو ••••

---

(١) لە گەلێك ناوچەدا سواری گوێ درێژ بون بۆ ئافرەت شورەیی‌یە ، تەنانەت بۆ سزاو ئەتك کردن ئافرەتیان سواری گوێ درێژ ئەکرد•

(٢) ئەو یاری‌یانـەی کـە تایبـەت هینی کوڕانن •• ئافرەت لێی دور ئەکەوتەوە •• تەنانەت یاری هاوبەشی کوڕانو کچان نیە •

# ئافرەتو خوێندەواری :

تا سەرەتای شەستەکانو بگرە بەرەو ژورتریش زۆر کەم لە دایكو باوکان کچیان ئەناردە قوتابخانەو پێیان ئەخوێندن ، ـ لە لادێکانا ـ کچ لە جیاتی خوێندنو خوێندەواری لە سەرەتای توانایاندا ئیشە سەرەتاییەکانی دەرو دەشتو کێڵگەکانیان پێ ئەسپاردن وەکو : بژار ، پاچە کۆڵە ، مەڵۆ کردن ، کێشە ، نانو چا دروست کردن ، ئیشی سەرپەرێز ، ••• ئەگەر بیشیان ناردنایەتە قوتابخانە بەر لەوەی



**ـ ئافرەت بەشداری ئەرکی بەخێوکردنی ئاژەل ئەکات ـ**

---

فێری نووسینو خوێندن بوونایە لە قوتابخانە ئەیان هێنانە دەرەوە هیچ بەتەنگ رۆشنبیریو دواروژی کچانەوە نەئەبوون ، چونکە بە پێی

نەریتی خێڵەکیانەی لادێکان تێکەڵ بوونی کچان لەگەڵ کوڕاندا تەنیا لە بواری ئیش کردنی دەرو دەشتو سەر کێڵگەکانا ئەبوو ئەویش کە مەسەلە ئابوری‌یەکە ناچاری ئەکردن •

## روپۆش یان

## بەرگی سەرەواڵا :

لەگەڵ ئەو دەست بەسەرا گیراوی‌یەدا لە پۆشاکو جلو بەرگدا سەربەستن‌و هێشتا عاباو پەچەو روو پۆشی رەش ریّی نەکەوتۆتە لادێکانەوە[1] •• چونکە ئەم عاباو خۆ پێچانەوەیە پاشماوەی نەریتی



ـ ئافرەتێکی لادێیی بێ عاباو رووپوش تەشی ئەڕێسێ ـ

(١) لەلادێدا بە گاڵتە پێ کردنەوە سەیری عەباو پەچە ئەکەن‌و خۆیانی لێ لا ئەدەن •• بۆ ئەوەی هەست بەوە بکەن کە دیاردەیەکی دواکەوتووانەیە •••

شارستانێتی سستەمی کۆمەلایەتی عوسمانیەکانەو لە شارەکانا سەری هەلداو هەر لەوێشدا بەمیراتی مایەوە •• بەلام بەداخەوە ئەو ئافرەتە لادێ نشینەی کە لە سەرەتای ژیانیەوە بە بێ رووپۆش ژیاوەو لە ناو کێلگەو دەرو دەشتدا خۆی دانەپۆشیوە ، کاتێك ئەبێتە شاری‌و ئەچێتە شارەوە بەر لە هەموو شتێك لە جیاتی بیر لە فراوان بوونی ئاستی هۆشیاری‌و سەربەستی خۆی بکاتەوە بیر لە عاباو پەچەو خۆ داپۆشین ئەکاتەوەو[1] هێلێك بە نێوان باری کۆمەلایەتی خۆی‌و پیاواندا ئەکێشێ، ئەمەش هۆی ئەوەیە نەك هەر باری کۆمەلایەتی لادێکانمان لەبارەی ئافرەتەوە دواکەوتووە ، بگرە شارستانێتی‌یەکەشمان شارستانیتی‌یەکی رووکەش‌و بێ بنچینەی زانستیانەیە ، لەنگەری خۆی لەسەر رەووشتی چاولێکەری‌و لاسایی کردنەوەی کوێرانە راگرتووە •

## ئیش کردن :

لە لادێدا هەموو کەس ئەبێ ئیش بکاو دەرودەشت بچێ‌و لە ئیش‌و کاری کشتوکال‌و کێلگەو مەزراکان‌و بە خێو کردنی ئاژەل‌و پەلەوەرو••••دا بە شداری بکات•• ئیش کردنی سەر مێزو بەر چەرخی کارگەو کەرەسەی کارەبایی‌و فابریقە تا ئیستا لە لادێکانا نیەو[2] ئیشی نیشتەجێ‌یی‌و دوکانداریش زۆر کەمەو ئەمەش بە زۆری بۆ پیرو پەککەوتەکان‌و کەم تواناکانە •• ئافرەت بەشداری هەموو جۆرە ئیش‌و

---

(١) ئەم دیاردە دواکەوتوویی‌یە تەنیا لە شارو نیمچە شارەکانا باوی هەیە ••

(٢) نەبونی کارگەو چەرخی گەورەی ئیش کردن ئاستی ژیانی لادێی بە دواکەوتوویی هێشتۆتەوە ••



- ئافرەت سەرپەرشتی دروست کردنی بەرهەمە شیرەمەنیەکان ئەکات -

---

کارێکی دەرو دەشتو گەڵا کوردنو خەرمانو دروێنەو ئاوداشتنو توتنو تەرەکاڵو .... ئەکات .. شان بە شانی پیاو بەرهەم ئەهێنێو بێ



- ئافرەت چاودێری پەروەردە کردنی منال ئەکات -

دوا کەوتن ئەرکی سەرشانی خۆی بەڕێوە ئەبات ، بەڵام لەژێر چاودێری پیاوان دا •• ئافرەت جگە لە ئیش‌و کاری دەرو دەشت‌و سەر کێڵگەکان ئیش‌و کاری ماڵەوەش رائەپەڕێنێ وەکو : درومان ، نان‌و چێشت دروست کردن ، میوان بەڕێ کردن ، جل شتن ، ماڵ رازاندنەوە بەخیوکردنی منالّ ••• کە ئەمانە بە تایبەتی ئیشی دیاری کراوی ئافرەتان‌و پیاوان دەستی لێوە نادەن •

## ئافرەت‌و
## پیشەی دەستی :

تا ئیستاش ماکی ئەو دابەشکردنە کۆمەڵایەتیەی کە لە هەزارەکانی دووەم‌و سێیەمی پێش زاینی دا باری کۆمەڵایەتی لە [مێ وەجاخی]یەوە گۆڕیە سەر باری [ نێر وەجاخی ] لە هەندێك شوێنداو ئیشی پیشەگەری سووکی خستە ئەستۆی ئافرەت‌و کشتوکاڵ‌و ئاودێری‌و شەڕو شۆریش بوو بە پیشەی



ـ کچان خەریکی فەرش دروست کردنن ـ

پیاوان ، هێشتا شوێنەوارەکەی لەناو ئافرەتی لادێدا ماوەتـەوەو ئافرەتی لادێ بە هۆی نەبوونی ئامێری تازەی پیشەگەری‌یەوە لـە وڵاتەکەمانا ،



ـ کچێکی پیشەگەر خەریکی فەرش دروست کردنە ـ



ـ ئافرەتێکی پیشەگەر تەونگەری ئەکا ـ

---

ئەو کەلو پەلە پێویستیانەی کـە لەگەل ژیانی رۆژانەی کۆمەلەکـەمانا بەکار دێن‌و پێویستن ، بە دەست وە لە سەر شێوەی سەرەتایی ، یان بە

چەرخی دەست گێڕ دەیان هێننە بەرهەم ، ئەمانەش دوو بەشن هەندێك لەم پیشە دەستیانە واتا بەشی یەکەمیان کـە شێوەی بـەرهەم هێنانیان فورسەو پێویست بە زۆر خۆماندو کردنو چەکوش کاری ئەکات وەکو:



**ئافرەت لە کاتی تەشی رستن دا -**

ئاسنگەری ، دار برین ، دار تاشی ، مس گـەری ، نەقاڕی و ٠٠٠٠٠ ئەمانە تایبەت بۆ پیاوانن ، بەڵام ئـەو ئیشە سووکە نیشتەجێیانەی کـە لە ماڵەوە ئەکرێن پیشەی ئافرەتە هونەرمەندە [دەست رەنگین] ەکانن[1]،

**(١) (دەست رەنگین) ٠٠ بەو ئافرەتانە ئـەڵێن کـە پیشـەی دەستی ئەزانن ٠٠**

وەکو : رستن ، چنین ، درومان ، چیخ کردن ، تەونگـەری ، [بەڕە دروست کردن] ، هەوڕگەری [دێزەو گۆزە] کەلارە دروست کردن ، ...بە زۆری ئافرەتی کوردەواری لەم پیشە دەستیانە ئەزانن .

## ئافرەتو ئابوری ماڵەباوان :

مەگەر بـە دەگمـەن ، ئەگـەرنا ئافرەتی لادێ نشین نەی توانیوە ببێتە خاوەنی مەسەلەیەکی ئابووری سەربەخۆی ناو خۆیی نە لـە ماڵە باوانو نـە لە ماڵـە مێردا .. هـەندێك ئافرەت نـەبێ کـە بـە هۆی دەستەبەری ماڵە باوانیانەوە بەشە ئابووری یەکی شێوە سەربەخۆیان هەبێ، ئەویش زوربەیان توانای خەرج کردنیان بـە ئارەزووی خۆیان کەمەو ئەبێ هەر پرس بە مێردە کانیان بکـەنو لـە قسـەیان دەر نەچن[1] ، ئافرەتی لادێ موچەو مانگانەیان نیـە ، ئـەرکی رۆژانـەیان بێ پاداشت بەڕێوە ئەبەن ، هـەر کاتێکیش ماڵە باوانیان بـەجێ هێشت ، یان لای مێرد بەرەو ماڵـە باوان گەڕانەوە خاوەنی هیچ شتێك نینو پـەیوەندی ئابووریانەیان لە هەردو حاڵەتەکەدا بە ماڵە مێردو ماڵە باوانەوە نامێنێ .

## ئافرەتو میرات :

زۆر کەم ئافرەتی لادێ نشین لـە پاشماوەی کێڵگـەو زەویو زارو باخو خانووبەرەو ئاژەڵو کەلوپـەلی ناوماڵو پارەو زێڕو تفاقی پـیاوان میراتی بەر بکەوتایە ، یان بی درایەتێ ، لەگەل ئەوەشدا کـە هەردوو

---

**(۱) دەرامەتی رۆژانەی هەمو خێزانێکی لادێ لـەسـەر ئابوری خێزان دا ئەنرێ .. وە بە تایبەتی ئافرەت توانای دەسکاری کردنی ئەو دەرامەتەی نیە .**

دەسەڵاتی یاساو شەریعەتی ئیسلام بۆ بەشیان نەکردوون •• زۆر کەم هەبووە ئافرەتێك میراتێکی خێڵەکیانەی لە ماڵە باوانەوە بردبێت بۆ ماڵە مێرد ، وە یان لە ماڵە مێردەوە هێنابێتەوە بۆ ماڵە باوان • ئەو ئافرەتانەش کە میراتیان ئەدرایە بەشێکی زۆر کەمتریان لە بەشی راستەقینەی خۆی پێ ئەدرا •• ئەمە بوەتە هۆی ئەوە کە ئافرەتی لادێ نشین نە لە ماڵە باوانو نە لە ماڵە خەزوران [وە یان مێردان] ماوەیان نەدراوە ببنە خاوەنی بەشێك لە مەسەلەی ئابوری خێزانەکەیانو بە ئارەزووی خۆی مامەڵەو مامەڵەکاری پێوە بکات •• هەر لەبەر ئەم هۆیەشە کە ئافرەت توانای شت کڕینو فرۆشتنو مامەڵەو مامەڵەکاری نەبوەو ئەو سەربەستیەی نەدراوەتێ کە وەکو یەکێك لە ئەندامی خێزانەکەیان نرخی فرۆشراوێك دەست نیشان بکات وەیان شتێکی تەوارەدار بێ پرسی گەورەی ماڵ بۆ ماڵەکە بکڕێ یان بی فرۆشێ •• هەندێك ئافرەت کە دەوری سەرگەورەی ماڵیان گێڕاوەو دەم ڕاستی ناو خێزانەکەیان بون ئەمانە زۆر کەمنو لە هەمان کاتا سەرپێچیان لە یاساو نەریتە کۆمەڵایەتیەکان کردوەو بەهێزی بەتواناییو لێ هاتوویی خۆیانەوە خۆیان لە کاروباری ئابوری ناو خێزانەکەدا فەرز کردوە ••

## ئافرەتو
## گەشتو گوزار

جگە لە ئیشو کاری دەشتو دەرو ناو کێڵگەکان ، هەندێك جار بەشداری کۆبونەوە گشتیەکانی وەکو : [پرسە ، زەماوەند ، مردوو بەرێ کردن ، هەرەوەز ، سەیرانو •••][1] ئەکەن ، بەڵام گەشتی شارانو ئەم لاو ئەو لا چون هێشتا بە نیسبەت ئافرەتی لادێ نشینەوە بیری لێ نەکراوەتەوە ، زۆر سەیرە کە زۆر جار هەندێك لە لاوە بەناو

(١) لەم بوارانەدا زوربەی ئافرەتان پێکەوەن ••

رۆشنبیرەکانمان[1] کە لە سەر سەربەستی ئافرەتو مافی رزگار بونیان لەو نەرێتە دەست بە سەراگیراویەی ئافرەتان ئەنووسن کەچی خۆیان لە هەمان کاتا ماوەی ئەوە نادەن خوشکەکانیان وەیان ئەو ئافرەتانەی پەیوەندی خێزانییان پێیانەوە هەیە بچنە سەیرانو گەشتی ئەم لاو



**- دیمەنی هەڵپەرکێیەکی ئافرەتان -**

ئەولا .. سەربەستی دان بە ئافرەت لە بواری گەشتو گوزارو ئەم لاو لا چون دا یەکێکە لە مەرجە پێویستیەکانی ژیانی ئافرەت کە راستەو خۆ کار ئەکاتە سەر فراوان بوونی ئاستی رۆشنبیریو باری بەرهەم هێنانی سەربەستیانەی .

## ئافرەتو هونەر :

زۆر کەم ئافرەت بەشداری ئەرکی هونەری میللی ئەکات ، یان لەسەر شانۆ دەرئەکەوێ ، ئەمە بە نیسبەت ئافرەتی شاریو روشنبیرەوە،

**(١) ئەو لاوانە ئەگرێتەوە کە تەنیا بە قسە داکۆکی لەسەر ئافرەت ئەکەنو بەکردەوە لێی دور ئەکەونەوە ..**

وه هەر ئەم خۆ شاردنەوەی ئافرەتە لە هونەرو هونەری شانۆ گەری کارێکی گەورەی کردۆتە سەر لاوازکردنی رێبازی پێشکەوتنی بەهرەی ئەم هونەرە میللی یە ..

وه هەر ئەم خۆ دور خستنەوەشە بۆتە هۆی دواکەوتنی هونەری شانۆگەری‌و هەندێك هونەری تری میللی‌مان لـە کوردستاندا .. لـە لادێکانا ئافرەتی لادێ بە تاکە فێری هـەڵپەرکێ‌و گۆرانی‌و چەپڵە لێدان ئەبن .. وه لە کۆنەوە لە هەندێك بواردا هونـەری ئافرەتان لـەگەل هونەری پیاواندا جیا کراونەتەوەو هێڵێکی ئاشکرا بە نیوانیانا کێشراوە.. تا ئێستا لـە لادێکانی کوردستانا [ مەگەر بە دەگمەن ] گـەرنا نەبووە ئافرەتێك وەکو پیشـەی هـەمیشەیی گـۆرانی بێژ بێ یـان لـە بوارە گشتی یەکان‌و کۆڕو کۆمـەڵ‌و ئاهـەنگەکانا بـە سـەربـەستی گۆرانی بڵێ[1] .. تەنانەت چەپڵە لێدان بۆ گۆرانی لە لادێکانا لە لایەن ئافرەتەوە بە شەرم دائەنرێ ..

مەگەر لە بوارێکی زۆر دەرکەوتوو میللی یانەدا ئافرەت تێکەڵاوی هەڵپەرکێی [رەشبەڵەك][2] بێ ، یان لـە کاتی هەرەوەزی ئیشی دەرو دەشت دا کە لـە کـەس‌و کارو دێ کـەیانەوە دوورن .. زۆرتری هەڵپەرکێی رەشبەڵەك لەو کاتانەدایە کە لـە کێڵگەکانا کۆ ئەبنەوە یان لە کاتی مازو گەزۆ کردنا لەناو دارستانەکانا ، چونکـە لـەم کاتانەوە زوربەی ئافرەتە ئیشکەرەکان لـە کـەس‌و کـارو بـاوك‌و براکانیانـەوە دوورن‌و خۆیان رێگای سـەربەستی خۆ نواندن بـە خۆیان ئەدەن .. ئافرەتی کورد وەکو حیکایەتخوان ئەو جێگەیە نەدراوەتێ کـە لـە ناو

---

(١) گورانی ئافرەت بـە زۆری مەقامـە خـەمناکـەکان‌و لاواندنـەوەو بالۆرەیە ..

(٢) هەڵپەرکێی تێکەڵاوی پیاوان‌و ژنان ..

کۆڕێکی فراواندا دابنیشێ‌و داستانێکی کۆنی رابوردو بەسەربەستی‌یەوە بگێڕێتەوە بۆ خەلك ‥ ئافرەت تەنیا لە رێگای دەرو دەشت‌و بـە دەم



ـ ئافرەتێك گلۆلە بەن هەل ئەكات ـ

---

ێشەوە لەسەر كێڵگەو مەزراكان ئەتوانی گۆرانی بلێ[1] ئەویش مەگەر زۆر تەنیا بێ‌و دڵنیا بێ لەوەی كەسێكی تر لە نزیكی یەوە نیە گوێی لێ بێ بتوانێ گۆرانی دڵداری بلێ‌و لە گۆرانیەكانیا لەگەل لاوێك وە یان دەسگیرانەكـەیا بدوێ ‥ زوربـەی گۆرانی ئـافرەتان خەمناكن‌و خۆیان ئـەلاوێننەوە ‥ وەیان شێوە ئاینی‌یە ، وەیان گۆرانی بـە جوانی ئافرەتێكی تردا ئـەڵێن ، ئـەم هـەموو گۆرانیە كوردی‌یـە فولكلوری‌یە پیاوان وتویانە نـەك هـەندێكیان بەڵكو بەشێكی زۆریشیان

---

**(١) دورە پەریزی ئافرەت لە گۆرانی بۆتەهۆی دواكەوتنی لایـەنیەكی هونەری كوردی ‥**

باسی جوانی ئافرەتو یارو دڵدارو دەسگیران ئەکەن بە ئاشکرا ، بەڵام سەیرەکە ئەوەیە ئەگەر کچێك گۆرانی بە کوڕێکدا بڵێ لێی ئەکرێ بە چەپڵە ڕێزانو پەنو شورەیی‌و لە زۆر شوێن‌و کاتا باسی بە خرابی ئەکرێ .

## ئافرەتو دڵداری :

ئافرەتی لادێ نشین وەکو هەموو لایەنە کۆمەڵایەتیەکانی تری ژیانیان لە دڵداری‌و دیاری کردنی دەسگیراندا سەربەست نین‌و[1] تەنانەت ئەم مەسەلەیە زۆر بە نهێنی لەناو دڵی خۆیانا ئەهێڵنەوە .. ئافرەتی لادێ لەم بوارەدا ئەمەندە سەرکوێر کراوە مەگەر لە دورەوە چاوی بە



ـ ئەم ئافرەتە خوری بە شانە ئەکات ـ

دەسگیرانی بکەوێ‌و سەرنجی بدا ، ئەوانە نەبێ کە کەس‌و کار واتا

(١) دلداری ئافرەت لە ناو دەرونی ئافرەتەکەدا تواوەتەوەو ، پەردەیەکی شێوە شورەیی بەسەر ئاشکرا بوونیا کێشراوە ..

باوکو براو ئامۆزا کـه پێیان ئەڵێن [حەقدار] دیاری‌یان ئەکـەن ..
خۆ ئەگەر لە شوێنێکی دوبەدوویدا ئـەم دو دەسگیرانە پێکەوە ببینرێن
ئەوا بە شێوەیەکی ناشیرین بۆیان حیساب ئەکرێ ..

## ئافرەتو شوو کردن :

دۆزینەوەی مێردو ، دیاری کـردنی سەرەنجامی ژیانی دوارۆژو
لەگەل مێرد پێکەوە ژیان [شووکردن] هێشتا لـە ژێر دەسـەڵاتی باوکو
براو کەس‌و کاردا ماوەتەوە[1] .. هەردو ماڵـە باوان ـ باوکی زاواو
بوك ـ مامەڵەو مامەڵەکاری بە شوو کردنی ئافرەتەوە ئەکەن کە ئەمەش
بنەمای ئـەو ریژیمـە کۆمەڵایـەتیە دوا کەوتوانـەیـە ماوەتـەوە کـە
دەرەبەگایەتی لەگەل خۆی‌دا بایەخی پێ ئەدان .. ئافرەتی لادێ لـە
شـوو کردنا هیچ دەورێکی خاوەنداریێتی مـەسەلەکـەی نیە بەڵکو تەنیا
وەکو کەرەسەیەکی بازرگانی زیندو سەیری مەسەلەکە ئەکاو سەرنجی
قوناغەکانی ئەدا .. باوکو برا مەسەلـەی شـوو کردنی کچ ئـەکەنـە
داردەسی چارەسەر کردنی چەندان گیرو گرفتی ئابوری‌یانو بە جۆرێکی
ناڕەوا مەسەلەکە ئەکەن بەژێر چمکەوە کـە تەنیا روکارە ئابوریەکەی
رەچاو ئەکەن .. جیاوازی تەمەن لـە نێوان کچی بەشـو دراوو ئـەو
زاوایەدا هـەر چـەند زۆر بێ لای باوکو برای کچ جێگای باس‌و لێ
دوان نیـە .. ئافرەت لـە دوای شوو کردنی هیچ پـەیوەندی‌یـەکی
ئابوریانەی بە ماڵە باوانـەوە نامێنێ‌و ناشتوانێ لە سامانی چـەند ساڵەی
پاشکەوتەی ماڵە باوانی ـ کە بە درێژایی تەمەنی رەنجی تیا داوە ـ هیچ
شتێك لەگەل خۆی ببات بۆ ماڵە مێردەکەی هەروەکو لە ماڵە مێردەکەشیا

---

**(1) ئافرەت لە بواری شوکردنا تەنیـا وەکو کەرەسەیـەکی بازرگانی مامەڵەی پێوە ئەکرێ .. توانای ڕا دەربڕینی نیە ..**



ـ کۆمەڵێك ئافرەت لە کۆبونەوەیەکی ماتەمیانەدا ـ

نابێتە خاوەنی هیچ مەسەلەیەکی ئابووری‌یانە ٠٠ شوو کردنی ئافرەتی لادێ بە پێی باری ناوچەو نەریتی خێڵەکیانەی کوردەواری چەند جۆرن وە هەر ناوچە یان هەر تیرەیەك چەند دابو نەریتێکی جیاجیایان لە بواری ژن خواستن‌و ژن بە شوو دانا هەیە[1] ٠٠ هەرچەند ئێمە لەم نامیلکە بچکۆلەدا ناتوانین هەموو روکارە کۆمەڵایەتی‌و دابو نەریتە خیلەکی‌و تیرە گەریەکان باس بکەین بە پێی دیاری کردنی سنووری ناوچەکان لێکیان جیا بکەینەوە ، بەڵام ئەوا ئەو شێوە گشتی‌یەی کە لە زوربەی ناوچەکانی کوردستانا باوی هەیە یەك لە دوای یەك‌و بە پێی توانا باسیان لێوە ئەکەین :

(١) بەڵام لە هەمویانا مافی ئافرەت زەوت کراوە ٠٠

## شیربایی :

کۆنترین بنچینەی دوا کـەوتووی مـەسـەلەی ئافرەتـە[1] ، یان بڵێین بارمتەیەکی دارایی‌یە ، کە کڕین‌و فرۆشتنی ئافرەتی پێ ئەکرێ ، ئەو ئافرەتانەی شوو ئەکەن ـ لە لادێکاناو تـەنانـەت هـەندێکیش لـە شارەکان کە هێشتا پابەندی ئەو نەرێتـە کۆمەلایەتیـە خێڵـە کیانەن ـ میقدارێك پارە وە یان پارچەیەك زەوی ، باخ ، کێڵگەیەك ، پارچەیەك چەك ، فەرش .... بە ناوی شیربایی‌یـەوە لـە بەهای ئافرەتە کـەدا وەر ئەگیرێ ، ئەمەش بە پێی داب‌و نەرێتی شوێن‌و ناوچە وەیان بـە پێی نەریتی تایبەتی تیرەگەری‌و تایـەفە کاری‌یانـە نرخ بۆ ئافرەتەکە دائەنرێ .. لـە هـەندێك بوواریشـدا ئافرەتی شۆخ یان ئیشـکەرو دەرکەوتو بەهای زیاد ئەکا .. وە ئەمـەش بـە پێی رێکـەوتنی نێوان هەردوو بنەماڵەی خەزوران دیاری ئەکرێ ، سەیر ئەوەیە ئافرەت کـە خاوەنی راستەقینەی مەسەلەکەیە ناتوانێ پەنجە بخاتە کارەکەوە ، وە یان سەرپێچی لێ بکات لە کاتێکدا ئەگەر باوك‌و براو کەس‌و کار لە سەر ئـەم کـارە رازی بون .. هـەرچـەند ئیسـتا ئـەم کارەش روو لـە کەمبوونەوەدایەو لە ژێر پەردەی شەرم‌و شوورەیی‌و ـ تا رادەیەك ـ بە دزی‌یەوە مامەڵەی پێ ئەکرێ .. ئینجا ئەمەیان گەورەترین بنچینەی نا هەمواری ژیانی ئافرەتی لادێ یە .. چونکە زۆر جار وا رێ ئەکەوێ ئافرەتەکە ئەو پیاوەی بـەدڵ نیەو حەز ناکا لە گەڵیا بژی ، بەلام بـە حوکمی سامان‌و رازی کردنی ماڵە باوانی دەست بەسەر حەزو ئارەزوو ژیان‌و دوارۆژی بەختیاری‌و ژیانی خێزانی ئەو ئافرەتەدا ئەگیرێ ، کە ئەمەش زوربەی لە ئەنجامدا ئەبێتە هۆی دورکەوتنەوەو رووداني چەندان ئاژاوەو گیرو گرفتی ژیان لە نێوانیانا .

---

(۱) گەورە ترین بنچینەی دواخستنی ئافرەتو ناشیرین کردنی روخساری کۆمەڵە ..

## ژن بەژن :

دیاردەیەکی زۆر ناپەسەندە[1] ، تاریکترین رووی ژیانی دوا کەوتەیی کۆمەڵ نیشان ئەدا ، ئاڵوگۆڕ کردنی دوو ئافرەتە کە لە بارمتەی یەکتری دا ئەدرێن ، هەریەکە ئەبێتە مایەی شیربایی بۆ ئەوی تریان جگە لەوەی کە خۆیشی ئەفرۆشرێ .. ئەمەش لە هەندێك شوێنا پارسەنگی هەیە ، وەکو ئەوە زۆر جار رێ کەوتووە کچە هەژارێك‌و کچە دەوڵەمەندێکیان ژن بەژن یان بڵێین ئاڵوگۆڕ پێ کردوە ، بە پێی نەریتی ناوچەکە هەمیشە پارسەنگی رێز بەلای کچە دەوڵەمەندەکەدا شکاوەتەوە[1] ، ئەبێ خاوەنی کچە هەژارەکە واتا ـ ماڵە باوانی ـ جگە لەوەی کە کچێك ئەدەن لە بارمتەی کچە دەوڵە مەندەکەدا ئەبێ شتێکی تریشیان بدەنێ ، یان زۆر جار ئافرەتێك لە بارمتەی دوو ئافرەتدا دراوە ، ئەمەیان لە کوردەواریدا تا ئێستاش لە زۆر شوێن‌دا باوی هەر ماوە ، وە تێکڕای ئەم مەسەلەیە لە ئەنجامدا ئەبێتە هۆی ئاژاوەو دڵ یەشان‌و زۆر جار لە بنەڕەتەوە هەڵ ئەوەشێتەوە .. سەرەتا ناکۆکی‌یەکە لە لایەنێکیانەوە روو ئەدات بەڵام لایەنەکەی تریش تێوە ئەگلێ‌و ئەبێتە هۆی دەست لە یەکتری هەڵگرتن‌و دەس بەردار بون لەو ژیانە هاوبەشی‌یە ..

ژن بەژن وەکو وتمان یەکێکە لەو دیاردە هەرە ناشیرینانەی کە تێکەڵ بە ژیانی کۆمەڵەکەمان بووەو کومەڵەکەمان ـ تاڕادەیەك ـ دەقی پێوە گرتووە .. لەم کارەدا ئافرەت جگە لەوەی خۆی وەکو کەلوپەلێك ئەفرۆشرێ لە هەمان کاتا وەکو دەس مایەیەك ئافرەتێکی تری پێ ئەکڕدرێتەوە ..

---

**(١) نارەوا ترین دیاردەی کۆمەلایەتیە کەژن دوجار ئەکات بە کەرەسەی فرۆشتن .. لەم بوارەدا ژن ئەفرۆشرێت‌و ئەکڕدرێتەوە ..**

**(٢) ئەمەیان دیاردەیەکی چینایەتی یە ..**

## زاوارە :

کورد ئەڵێ : [ نەبوونی سەر بە ماڵی دوژمنا ئەکا ] واتا مرۆڤی دەس کورت‌و نەدارا پەنا ئەباتە بەر گەلێك شتی ناڕەوا لە ژیانا[1] •• ئەمەیان ئەوەیە کاتێك لاوێك ئەیەوێ ژن بخوازێ ، بەڵام نەپارەی شیربایی‌و نە بارمتەی ژن بە ژنی نیە[2] ، بۆ ئەمە لەگەل ماڵی خەزورانی واتا ـ ماڵە باوانی کچدا ـ رێ ئەکەوێ کە ماوەی ساڵێك یان زیاتر ـ بە پێی رێکەوتنی نێوان خۆیان ـ لە ماڵی خەزوران بمێنێتەوەو « وەکو رەنجبەر » ئیشیان بۆ بکات ، بەرو بوومی رەنجی ئەو ماوەیە بکەوێتە بارمتەی شیربایی‌یەوە ، ئەم رواڵەتەیان هەندێك جار بەر لەوەی ماوەی دیاری کراوی ئیش کردنی [زاوا] تەواو بێ‌و بێتە سەروکاری گوێزانەوەی دەسگیران ، گیروگرفتی تێ ئەکەوێ‌و هەڵ ئەوەشێتەوە •

## گەورە بە بچوك :

ئەمەش جۆرێکی تری ژن بەژنە کە بە ئاشکرا مۆرکی دواکەوتنی کۆمەڵی تیا دەرئەکەوێ[3] ، وە ئەمەیان لە هەمو کاتێکدا گیروگرفتی لە ژن بەژن زۆر ترە •• ئەم کارە لەسەر ئەوە دامەزراوە ئافرەتێکی هەرزەکار ئەگۆڕنەوە لە بارمتەی کچێکی مناڵ دا ، کچە مناڵەکە بۆ کوڕێکی مناڵ‌و کچە گەورەکە بۆ کوڕێکی گەورە •• ئینجا زۆر جار باوکی کچ ، کچی خۆی ئەدا بەژن بۆ خۆی کە تەمەنیان هاوشانی یەك نیە ، وەیان زۆر جار رێ ئەکەوێ پاش ئەوەی کچی گەورە گوێزرایەوە بە ماوەیەك کچی بچکۆلەی دیاری کراو لە بارمتەی کچە گوێزراوەکەدا

---

(١) ئەمەیان باری ناخۆشی گوزەرانی خەڵك دەرئەخات ••
(٢) لەهەندێ ناوچەی تری کوردستان زاوا بەندیی پێ ئەڵێن •
(٣) لەم بوارەشدا ئافرەت لە هەردو لاوە مامەڵەی پێ ئەکرێ ••

ئەمرێ ، ئەمــە ئەبێتــە هۆی خولقــاندنی گیروگرفتێکی تازە لــە نێوان هەردوو بنەماڵەکەدا ، یان ئــەبێ کچێکی تریان بدەنێ یان پارەیەك بــە ناوی شیربایەوە یان ئەوەتا ئەمانیش کچی خۆیان لــە ماڵە خــەزوران دێننەوە .. ئەنجــامی ئەمــەش هــەمان ئــەنجامی پڕ لەسەرگەردانیو ئاڵۆزییە کە لە بنچینەکانی ترا روو ئەدات .. ئەمانەش هەمو سەرباری ئەو ناکۆکییە نهێنییەی کــە لــە ناو دڵی زوربــەی ئافرەتــە ئاڵوگۆڕ پێکراوەکانا هەیە ..

## خوێن خۆش کردن :

روو ئەدات کابرایەك لە دەستی دەرئەچێ ، یان بە هەر هۆیەکی ترەوە بێ زەلامێك ئــەکوژێ ، دوژمنایەتی ئەکەوێتــە نێوان هــەردوو بنەماڵەکــەوە ، ئافرەت لێرەدا ئــەبێتە قوربانی دەستی هــەرزە کرداریو کەرەسەی ئاشت بوونەوەی رووداوەکە لــە نێوان هــەردوو لادا[1] .. لەسەر داخوازی کەسوکاری کوژراوەکــە رێ ئەکەوون کــە بنەماڵەی پیاو کوژەکــە ئافرەتێك یان ئافرەتێكو هــەندێك پارە ، یان ئافرەتێكو پارچە زەوییەك ، باخێك ، پارچەیــەك چــەك ،..... بدەن بــە ماڵی کوژراوەکە ، پاش ئەم رێکەوتنە بەو ئافرەتەی کە ناکۆکیەکەی پێ کپ ئەکەنەوە ئەڵێن : [لە خوێن دا گیراو]وە بە کارەکــەش ئــەڵێن [خوێن خۆش کردن] .. واتا لــە بارمتــەی خوێنی کوژراوەکەدا وەرگیراوە ، ئینجا ماڵە خەزورانی ئەو ئافرەتەو کەسو کاری کوژراوەکە هــەرگیز دڵیان لــەم ئافرەتە پاك نابێتو هــەمیشە وەکو قاتڵێکی گیراو ســەیری ئەکەنو رێزی لێ ناگرنو بە تایبەتی ئازاریشی ئەدەنو رێش ئەکەوێ لە پەنامەکیەکدا بێ کوژنەوە .. خۆ ئەگەر هاتو ئــەو ئافرەتە لــە خوێن

---

**(١) ئافرەت لەم بوارەدا تەنیــا دەوری کــەرەســەی ئاشــت بونــەوە ئەگێرێ ..**

گیراوه بڕواتەوه ماڵەباوانی بەو نیازه کە ئیتر نەیەتەوه بۆ ماڵە خەزوران ئەوا مەسەلەی خوێنەکە سەر لەنوێ دەست پێ ئەکاتەوه ‥ ئینجا ئەو ئافرەتە تا مردن دەست بەستراوی دوژمنەو لەو زیانە تاڵەدا ئەژی ‥ زۆر جار هەر بۆ ئەوەی ئەو ئافرەتە لە حاڵەتێکی دەرونی ناخۆشدا بژی ژنی بەسەر دێنن کەوا ئیستا دێینە سەر باسی ژن بەسەر هێنانو روکارە ناشیرینەکانی ‧

## ژن بەسەر هێنان :

هەرچەند ئاینی ئیسلامو تا ئەم دواییەش یاسای کۆمەڵایەتی رێگری لەوە نەئەکرد کە پیاوێك ببێتە خاوەنی دوو ژن یان زیاتر ‥ زۆر جار پیاو لە ناوچەی کوردەواریدا دوژن یان زیاتری هێناوەو ئەمەش هەریەکە بە جۆرێك پابەندی پێویستی‌یەکی رۆژانەی تایبەتی بووه ‥ زۆر کەس لەبەر بەڕێوه بردنی ئیشو کاری ناوماڵو میوان بەڕێ کردنو ئاژەڵ بەخێو کردن ناچار ئەبو کە دوژن بێنێ[1] ، وه یان لەبەر نەبوونی مناڵ واتا لەبەر وەجاخ کوێری ـ وەکو ئەڵێن ـ ژنێکی تری ئەهێنا بەو هیوایەی کە لە ژنی دوهەم مناڵی ببێ ‥ وه یان ناکوکی توندو تیژی نێوان ژنو مێرد ئەگەیشتە ئەو رادەیەی کەپیاوەکە بۆ تۆڵە سەندن لە ژنەکەی ژنێکی تری ئەهێنا ، یان هەر لەبەر تەوژمی ئارەزووی جنسی پیاوەکە وه یان چەند ئیعتیباراتێکی‌تر لە زۆر جێگادا دو ژن یان زیاتر ئەگوێزرایەوه ، هەر کام لەمانەو هەر هۆیەك لەمانە بوایە کارەکە کارێکی ناشیرینو نا دیموکراتیانەیە ‥ لەم بوارەدا زەوت کردنی سەربەستی ئافرەت زیاد لە روکارەکانی تر بە دیار ئەکەوێ ‥

---

(١) بنەماڵە هەژارەکان کەمتر ئەم کارەیان تیاروو ئەدات ‥

(٢) لێرەدا دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی پیاوان بە تەواوی ئاشکرا ئەکا ‥ لەبواری دروستکردنی هەوێساری دا ‥

وە ئەمەش زۆر جار ژنــە هاو مێردەکان پێکــەوە توانیویانە بژین ئیتر لەبەر هەر هۆیەك بو بێت ، وە زور جاریش هەر لە یەکــەمین رۆژی سەرەتای گواستنەوەی ژنی دووەمەوە ناکۆکیو توندو تیژی لــە نێوان ژنی یەکەمو مێردەکەدا لەلایەکو نێوان هەردوو ژنەکەدا لە لایەکی ترەوە دەستی پێ کردوەو زوربەی ئــەنجامیش بۆتــە هۆی جیــا بوونەوەو



**- پیرەژنێك بە کۆڵە دارەوە -**

---

هەڵوەشاندنەوەی خێزانی یەکەم لە بنەڕەتەوە یان سەرنەگرتنی خێزانی دووەم ..وە زۆر جار هەریەك لەم بنچینە ناڕێکانە بۆتە هۆی خۆکوشتنو خۆ دەرمان خوارد کردنی ئافرەت وە یان دەرمان خوراد کردنی پیاوەکە.

## رەووشتی زاوا :

ئەوەی لەم بوارانەدا کە بیری لێ نەکرابێتەوە رەووشتی زاوایە ، نەگەر زاوا شیربایی ، یان بارمتەی ژن بەژن ، یان هەر هۆیەکی تری رازی کردنی ماڵە خەزورانی هەبوو ، ئەوا ئیتر مەگــەر بەدەگمــەن

پاوکی کچ بیر لــە رەووشتی یان نەخۆشی وە یان ناوو ناو بانگی زاوا بکاتەوە[١] •• بەلای زوربەی لەو باوکە کچانەوە گرنگ ئەوەیە داخوازیە کانیان بە بێ کەموکورتی بەدی بێت •

زۆر جار ئافرەتێکی شۆخی دامێن پاکی هێمن و رەووشــت جوان گیرۆدەی پیاوێکی رەووشت نزمی نەخۆش ئــەبێ وناتوانێ لێی دەرباز بێ ، هــەر وەکو زۆر جاریش بــە پێچەوانەوە ئافرەتێکی دەمــەوەری تەمبەڵ و هیچ نەزان ئەبێتە هاوسەری کوڕێکی ژیرو فرمانکەرو ئازا[٢] •• بەڵام هەردوولا لــە هەردوو حاڵەتەکــەدا ناچار ئــەبن مل بۆ بڕیاری کەس و کاری لە خۆیان گەورە تر کەچ بکەن •• وە لەم بوارەدا بــە زۆری ئافرەت زەرەر ئــەکا ، وە چونکــە شتەکــە لــە ســەر بناغــەی خۆشــەویستی و بــە ئارەزوو یــەکتر ناسین نیــە لــە ئــەنجامدا هــەر هەرەس دێنێ •

## هاوماڵ چێتی :

ئەمەش دەردێکی کوشندەو چاولێکەری یەکی پاشــکەوتووانەیە کــە تەماشای پلەو ئاستی دارایی ماڵەباوانی هــەردوولا ئەکرێ ، بۆ نمــونە ئەگەر کوڕە جوتیارێك لەگــەل کچــە ئاغایەکدا ، یان کوڕە هەژارێك لەگەل کچە دەوڵەمەندێکا یەکتری یان خۆش بوێ ، ئەو نەریتە هاوماڵ چێتی یە هەرگیز رێگای بەیەك گەیشتنیان نادا[٣] ، بەڵام بــە پێچەوانەوە ئەگەر کوڕە دەرەبەگێك ، یان کوڕە دەوڵەمەندێك بیەوێ کچی جوتیارێك یان یەکێك لە خۆی هەژار تر بخوازێ ئــەوا زۆر بــە ئاسانی بۆی

(١) لەم بوارەدا تەنیا جێ بەجێ کردنی دا خوازیەکانی ماڵە خــەزوران خۆی ئەنوێنێ •• کە ئەویش شیربایی یە ••
(٢) هەردو حاڵەتەکە لە کوردەواری‌دا هەیە ••
(٣) ئەمەش دیاردەیەکی تری چینایەتیانەیە ••

ئەچێتە سەر ، کۆلکە دەرەبەگەکان کە هێشتا عەنعەناتی دەرەبەگایەتی لە مێشکیانا ماوە هەرگیز کچ بە چینی جوتیارو هەژار نادەن .. ئەگەر کۆلکە دەرەبەگێکی وەك خۆیان دەست نەکەوت ئینجا کچەکەیان ئەدەن بە کوڕە مەلاو کورە شێخی ناوچەکە یان فەرمانبەرێك..بەو مانایە کە ئەمانە خۆیان لە چینی بۆرە پیاوان ـواتا هەژارەکان ـ بە گەورە تر ئەزانن .. لە بواری هاومالْ چێتی دا بەربەرەکانێ یەکی چینایەتیانەی نهێنی لە نێوان چینە جۆربەجۆرەکانی ولاتی کوردەواریدا هەیە لە مەسەلەی ژن خواستن‌و ژن بە شوودانا .. ئەم بەربەرەکانێ چینایەتیەش زۆرتری بە نەریتی خێلّەکیانەو باری ئابوری توێژو تیرەو هۆزەکانەوە بەندە . زۆر جار رێ ئەکەوێ کچە ئاغایەك‌و کوڕە جوتیارێك ، یان رەنجبەرێك بە دزی‌یەوە رێك ئەکەوون‌و هەردوو لا تەوقی مل کەچ کردن بۆ باری چینایەتی ئەشکێنن‌و مالْە باوان بەجێ دێلّن‌و ئارەزووی خۆیان ناکەنە قوربانی نەریتی کۆمەلْ ..

## رادوو کەوتن :

رادوو کەوتن ئەنجامی سەرگرتنی حەزو ئارەزووی خۆشەویستی‌ی نهێنی دو دلْداری کوڕو کچە[1] ..زۆر جار ئەو دوو کوڕو کچەی کە یەکتریان خۆش ئەوێ‌و حەز ئەکەن لە گەل یەکتری دابژین لایەنێك لە مالْە باوانەکان بە هۆی یەکێك لەو نەریتە دوا کەوتوویانەوە کە باسمان کردن ناچنە پێشەوە کە ئیشەکە بگونجێنن ، وە ئەم نەچونە پێشەوەش زۆر تر لە لایەن مالْە باوانی کچەکەوە روو ئەدات ، پاش دلْنیا بوون لە بەیەك نەگەیشتن هەردو لا رێ ئەکەون‌و مالْە باوان بەجێ دێلّن .. ئینجا گەلێك لەمانە پاش ماوەیەك هەردو مالْە باوان

---

**(١) بە زۆری لە نێوان کوڕی هەژارو کچی دەولەمەندا ، یان کوڕە جوتیارو کچە ئاغادا رو ئەدات .**

لەسەر پارەیەك یان زەوی وەیان باخێك .... رێ ئەکەوون کوڕو کچ ئەگەڕێنەوە . لە هەندێك ناوچەشدا شتەکە بۆتە شتێکی شێوە ئاسایی‌و هەر لەپاش چەند رۆژێک یان چەن هەفتەیەك کورو کچ ئەگەڕێنەوە ماڵە باوانو ماڵە باوانی کچ رازی ئەکەن . بەڵام ئەگەر کچە دەرەبەگێك لەگەل کوڕە جوتیارێکدا بڕۆن ئەوا ناوێرن بێنەوەو لەم لاشەوە ماڵە باوانی کوڕەکە دو چاری گەلێك زیان و چەرمەسەرە ئەبێ بە دەست دەسەڵاتی دەرەبەگەکەوە ..

## خشڵی زێڕ :

ئیستا لە ناوچە - بە ناو پێشکەوتووەکانی - ولاتە کەمانا ئەم دیاردە ناشیرینانەی کە پەیوەندی‌یان بە یاساو دەسەڵاتی سەردەمی دەرەبەگایەتیەوە هەبووە ، زوربەیان لەناو چوون ، بەڵام لە جێگای هەندێکیان مەسەلەی خشڵی زێڕ هاتۆتە پێشەوە[1] ماڵە باوانی کچ وەکو بیانوویەك داوای چەند پارچەخشڵێکی زێڕ ئەکات وەکو بارمتەی بەهاداری بۆ کچەکەیان ، کە ئەم بیانووە لە زۆر کاتا ئەبێتە هۆی سەر نەگرتنی کارەکەو سەر لە نوێ هەمووی هەڵ ئەوەشێتەوە .. بەڵام لە زۆر کاتیشا ئەگەر کوڕو کچ دڵخوازی یەك بن لە نێوان خۆیانا رێ ئەکەوون بۆ ئەوەی کارەکەیان سەر بگرێ‌و هەڵ نەوەشێتەوە ئەو ئەندازە خشڵە زێڕەی کە ماڵە باوانی کچ داوای ئەکات بە گورجی جێ بەجێی ئەکەن‌و لەپاش زەماوەند کردنەکە یان خشڵەکان ئەفرۆشنەوە بۆ پێویستیەکی تری ژیانیان[2] .

---

(۱) ئیستا خشڵی زێڕ ، وەکو بیانویەك گەورەترین دەوری ناشیرین ئەگێڕێ ..

(۲) ئەم خشڵە بە تەنیا ئەبێتە هێنی ئافرەتەکە ..

## خشلی خواستەمەنی :

هەندێك ماڵە زاوا کە دەسکورت بن‌و توانای کڕینی ئەو ئەندازە خشڵەیان نەبێ کە ماڵە باوانی کچ داوای ئەکات ، بە پێی ڕێکەوتنی نهێنی نێوان بووك‌و زاوا ، چەند پارچە خشڵێك ئەخوازن‌و لەپاش زەماوەندو گواستنەوە بە ماوەیەك ئەیبەنەوە بۆ خاوەنەکەی . بەمەدا دەر ئەکەوێ کە ئاستی بیر کردنەوەی زاواو بووك شارستانیانە ترو پێشکەوتوانە ترە تا هەردوو ماڵە باوان .

## جل هەڵگرتن :

بە پێی داب‌و نەریتی ناوچەکانی کوردەواری ئەگۆڕێ ، لە هەندێك شوێنا ماڵی زاوا بە ئارەزووی خۆیان جل‌و بەرگ هەڵ ئەگرن‌و ئەیکەن ، لە هەندێك ناوچە یان بنەماڵەدا ئەبێ بەپێی داخوازی ماڵە باوانی کچ بێ ، هەندی جاریش لە هەندێك پارچەدا پرس‌و ڕا بە کچەکە ئەکەن ، بەڵام لە مەسەلەی جل هەڵگرتنی ژن بەژن دا ئەبێ جل‌و بەرگی هەردوولا وەکو یەك‌و بە قەدەر یەك بن .

## شەکراو خواردنەوە :

لە هەر ناوچەیەك جۆرێکە بە پێی دابی خێڵەکیانە[1] ، کۆمەڵێك لە دۆست‌و ئاشنایانی هەردوو ماڵە باوان ، ئێوارەیەك لە ماڵە باوانی کچ دا کۆ ئەبنەوە شەربەت‌و میوەو شیرینی‌یەکی تایبەتی دائەنرێ‌و ، قوتوی شەکراو بەسەر میوانەکانا دابەش ئەکرێ‌و ، چەند قوتویەکیش لەو شەکراوە - بە پێی دەسەڵات - ئەبرێن بۆ ماڵە ئاشناو دۆستانی هەردوو لا ، ئەو ماڵانەی کە بۆیان ئەکراوە بێن بۆ کۆبونەوەی شەکراوەکە ،

---

(١) لە هەر ناوچەیەك جۆرێکی تایبەتی‌یە ..

وه یان بانگ نه‌کراوون •• ئه‌مه‌یان وه‌کو شێوه کۆنه‌که‌ی نه‌ماوه‌ته‌وه‌ نه زۆر شوێنا رواڵه‌تێکی تازه‌ی کراوه به به‌را به‌ره‌و زیاده مه‌سرف کردن ئه‌ڕوات خه‌ریکه بێته یه‌کێك له ئه‌رکه گرانه‌کانی کاروباری زه‌ماوه‌ن کردن ، چه‌ند شه‌وێك دوای ئه‌وه به‌رگی ده‌سگیرانی ئه‌کرێته به‌ر بوك •• ئێستا له شاره‌کاندا وه‌ها باوه که له‌و شه‌وی به‌رگی ده‌سگیرانیه‌دا ئه‌لقه‌یه‌ك ئه‌کرێته په‌نجه‌ی بوك که نیشانه‌ی خۆشه‌ویستی بێ کۆتایی لێ نراوه •• تا ئه‌م رۆژگاره‌ی دواییش له لادێکانا ئه‌لقه له په‌نجه کردن باوی نه‌بوو به‌ڵام ئێستا به هۆی په‌یوه‌ندی به تینی کۆمه‌ڵایه‌تی نێوان شارو لادێکانه‌وه خه‌ریکه له لادێکانیشا بێته باو ، هه‌رچه‌ند روخساری ژن خواستن‌و زه‌ماوه‌ندو جل له‌به‌ر بوك کردن‌و هه‌مو لایه‌نه‌کانی تری مه‌سه‌له‌که هێشتا دو روکاری جیایان هه‌یه له‌نێوان شارو لادێدا •• به‌ڵام به پێی حوکمی رۆژگارو په‌یوه‌ندیه‌کانی نێوان شارو لادێ گه‌لێك له نه‌رێته خێڵه‌کیانه‌کان خه‌ریکن له‌گه‌ل داب‌و ده‌ستووری شاردا تێکه‌ڵ ئه‌بن و جێگای خۆیان ئه‌گرن ••

## خه‌نه به‌ندان :

ئه‌و شه‌وه‌ی که ماڵه باوانی زاوا [برازاوا][1] ئه‌نێرن به شوێن بووکا ، ژنانی ئاوایی‌و ده‌سته خوشکه‌کانی بوك له ماڵه باوانی بووك دا کۆ ئه‌بنه‌وه‌و ئه‌بێته ئاهه‌نگێکی ژنانه‌ی سه‌یر •

نان‌و چا دروست ئه‌کرێ‌و ، شه‌کراو دابه‌ش ئه‌کرێ ، خه‌نه‌یه‌کی زۆر ئه‌گیرێته‌وه هه‌ر ژنێك بیه‌وێ له‌گه‌ل بووك دا ده‌ست‌و قاچی خۆی

---

(۱) ئه‌و کۆمه‌ڵه خه‌ڵکه‌ن که له ماڵی زاواوه ئه‌چن بووکه‌که دێنن •• ئه‌مه ئێستا له شاره‌کانا باوی نه‌ماوه به‌ڵکو کورو کچ پێکه‌وه گه‌شتێکی بچوکی بۆ ئه‌که‌ن که‌پێی ئه‌ڵێن ( شهر العسل ) •• ( سه‌ره‌تای شیرین ) ، یان ( رۆژانی زێرین ) له جیاتی ناوی ( مانگی هه‌نگوین ) که‌هه‌ندێك وای ناو ئه‌به‌ن ••

ئەگرێتە خەنە ..لەو شەوەدا جلی بووکێنی ئەکرێ بەبەر بوکەکەدا .

## برازاوا :

ئەو کۆمەڵە سوارەیە کە لە ماڵە باوانی زاواوە ئەچن بـە شـوێن بوکدا بوك سـواری ماینێك ئـەکرێ[1] وبرازاواکان بـە دەوریانەرمە عارغارێن ئەکەن تا ئەگەنە پێشەوە ، واتا ماڵە باوانی زاوا .

ئنیجا لەکاتی دابەزینی بووكو چوونە ژورەوەی دا زاوا لە شوێنێکی بەرزدا رائەوەستێو لە کاتی چونـە ژورەوەی بووکـدا زاوا هەندێك شیرینی یان میوە بەسەر بووکەکەدا هەڵ ئەدا[2] .

## زەماوەن :

رۆژی بووك گواستنەوە لـە ماڵە باوانی زاوا نانو چێشتێکی زۆر دروست ئەکرێو خـەڵکێکی زۆر لـە ناو دێو ، دێکانی دەوروبەرو ، خزمو دۆستانی ماڵی زاوا ـ بە پێی توانا ـ بانگ ئەکرێن بۆ سەر ئەم شایی‌یە .. لە رۆژەکانی بەر لە هاتنی بووکەوە تا هاتنیو دابەزینی بووك لە شوێنێکدا لە ناو دێ ئاگر ئەکرێتەوەو دەس ئەکرێ بە دەهۆڵو زورنا لێدانو گۆرانی وتنو هەڵپەڕکی ..

## چوونە پەردە :

ئەو کاتەیە کە بووكو زاوا بە یەك ئەگەن .. کە بە کاتی زێڕین یان شەوی زێڕین ناو نراوە[3] ئەنجامی چاوەڕوانی پڕ لە خۆشەویستیو دڵداری رابوردووی بوكو زاوایە .. ئەو کاتەیە کـە لـە ژیاندا لە بیر .

---

(١) جاران بـەم جۆرە بوو ، بـەڵام ئێستا بـە هـۆی ئۆتۆمبێلو رێگاوبانەوە ئەم باوە کەم بۆتەوە ،بوك بە ئۆتۆمبیل ئەگوێزرێتەوە.

(٢) لە هەندێك ناوچەش بە دارقامیشێك ئەدەن لە سەری بووکەکە ..

(٣) ئەگەر تەنیا لەسەر ئارەزووی باوانی هـەردوو لا بێ ئـەوا لەو کاتەوە ئەکەونە ناو دۆزەخی ژیانەوە ..

ئاچێتەوەو ئەبێتە نوختەی یەکانگیر بونی کۆتایی ژیانی تەنیاییو سەرەتای ژیانی جوتە هاوڕێ یەتی کە لەو کاتە بە دواوە خێزانێکی تر لە کۆمەڵدا دێتە کایەوە •• ئنجاپاش ڕاگەیاندنی بە یەك گەیشتنی بووك زاوا [ واتا چونە پەردە ] یان دووسێ تەقە ئەکرێتو خەڵکی بەشدارانی ئاهەنگی زەماوەنەکە تێ ئەکەن کە زاوا چۆتە پەردەو کاری خێر سەری گرتووە، ئینجا خەڵکەکــە دەست ئەکــەن بــە بڵاو بونەوەو کۆتایی بــە ئاهــەنگی زەماوەنەکە دێت ••

## پێخەسوو :

لە لادێکانا ، تا ئیستاش ، مە گەر ، بە دەگمەن بووكو زاوا وەکو چۆن ئیستا لە شارەکانا باوە یەکەم شەوی بووكو زاوایی بە جوتە بچن بۆ شارێك[1]و پاش چــەند ڕۆژێك بێنەوەو ئینجــا ســەرەتای پێکەوە ژیانیان دابمە زرێنن ، بەم جۆرە نیــە •• شــەوی گوێزانەوەی بوك بۆ ماڵی زاوا لە ماڵە باوانی بووکەوەژنێك یان ئافرەتێکی سەرە[2]لەگەل بووکەکەدا دێت بۆ ماڵی زاواو گوایە ئەو شەوە ئامۆژگاری بووك ئەکاتو بۆ سبەینێ ئەگەڕێتەوە ماڵە باوانی بووكو هــەواڵی ڕوو سووری بووك دێنێتەوە •

## تەڵاق دان :

بە پێی دەسەڵاتی شەریعــەتی ئیسلامو یاسا ، هــەر لــە کۆنەوە جڵەوی جیا بوونەوەی ژنو مێرد بە دەست پیاوانەوە بووەو پیاو لە هەر کاتێکدا ویستبای ئەیتوانی ژنەکەی تەڵاق بداتو پەیوەندی خێزانی یان بپچڕێنێ ، لێرەدا دەســەڵاتی دروست کردنی خێزانو درێژە پێ دانیو هەڵوەشاندنەوەی بە دەست پیاوانەوەیە ••

---

(١) هەمان (شهر العسل)ە کەبۆتە چاو لێکەری ••
(٢) واتا ئافرەتێکی بە ساڵا چوو •• دنیا دیدە ••

## تەڵاق بە تەڵاق :

ئەمەیان دووچاری ئەو کەسانە ئەبێ کـە ژن بەژن یان کردوە ، ئەگەر ناکۆکی کەوتە ناو یەکێك لەو دوو خێزانەی کەژن بەژنە کەیان کردوەو گەیشتە رادەی لێك جیـا بونـەوەی پیاوو ژنێکیان ، ئـەوا لایەنەکـەی تریش ناچار ئـەبێ دەسـت لـە ژیانی ژنو مێردایـەتی هەڵگرنو ئەوانیش لێك جیا ببنەوە[١] ، خۆ ئەگەر هاتوو لایەنێکیان ژنەکەی خۆی تەڵاق داو جیا بوونەوەو ماڵەکەی تر وەك خۆی مایەوە ئەوا سەر لەنوێ بەزمی شیربایی دێتە پێشەوە ، بـە پێی نەرێت یان ئەبێ ئەوانیش کچەکەی ئەمان تەڵاق بدەنو بێنێرنەوە ماڵە باوانی ، یان ئەوەتا بە پێی رێکەوتنی سـەر لـە نوێی نێوان هـەردوو لایان شتێکی وەکو شیربایی بە ماڵە باوانی کچی تەڵاق نەدراو بدرێ[٢] .

## حاشا کردن :

جۆرە جیا بوونەوەیەکی نێوان ژنو مێردە کە لەسەر ئارەزووی ژنەکە روو ئەدات ، ئـەو ئافرەتانەی کـە دڵیان بـە ماڵو مێردەوە نیە ـ سا لەبەر هەر هۆیەك بێ ـ بە بێ پرسی مێردەکەی ئەڕواتەوە بۆ ماڵە باوانیو پێ دائەگرێ کـە نایەتەوە ، لـە ئەنجامدا پیاوەکە ناچار ئەبێ تەڵاقی ئەدات .. ئەم جۆرە حاشا کردنە زۆر جار روو ئـەدات وە هۆی هەرە بنچینەیی ئەوەیە کە بـەر لە یەك گرتنیان رێگای ئەوە نەدراوە بە کوڕەکەو کچەکـە کـە یـەکتر ببینن‌و لـە خووو رەووشتی یەکتر تێ بگـەن ، هـەر دیزە بـە دەرخۆنـەی لێ کراوەو لەسـەر ئارەزووی رێکەوتنی هەردوو ماڵە باوان کارەکە دامەزراوە .. ئەوەتە

---

(١) ئەمەبە تایبەتی لە ئەنجامی ژن بەژندا روو ئەدات ..

(٢) بە زۆری نەبوونی منـاڵ لـە لایەنێکیانەوە ئەبێتە هۆی روودانی ئەم کارە .

به ئەنجامدا بەو جۆرە هەرەس دێنێو ئەبێتە هۆی وێران کردنو تێك دانەوەی خێزانێك •

## پارە پێوە بەستن :

زۆر جار ئەو پیاوانەی کەژنەکانیان تـەڵاق ئـەدەن پارەی پێوە ئەبەستن •• مەسەلەن لە سەر مەبلەغێك پارە تەڵاقی ئەدات ، واتا هەر کات ، وە هەر کەسێك ئەو مەبلەغە پارەیە بە نیازی بژاردنەوەی پارەی ئەو ژنە بدا بە کۆنە مێردەکەی ئەوا ئیتر کۆنە مێردەکەی حەقی بە سەریەوە نامێنێ[1] ، ئەم پارەیە بژاردنەوەی ئـەو ئەرکو شیربایی‌یەیە کە لە کاتی خۆیا مێردەکەی داویەتی بە ماڵە باوانی کچەکە •• ئینجا نـە زۆر کاتا مێردی دووەم پاش ئـەوەی ئـەو مـەبلەغـە پارە پێـوە بەستراوەی بژاردەوە ، ئەبێ شتێکی تریش شێوە شیربایی بدا بە ماڵە باوانی ژنەکە یان ژن بە ژنی پێ ئەکەنەوە •• وە گەلێك جار شتی سەیر روو ئەدات وەکو ئەوە رێ ئەکەوێ کە شیربایی جاری دووەم لە شیربایی جاری یەکـەم زۆرتر ئـەبێ ، جگە لـە بژاردنەوەی قەرزەکەش کـە خراوەتە پێی •

## مارەیی :

ئەمەیان شتێکی شەرعیو یاساییە ، کە ئافرەت لە سەر میقدارێك پارە یان زێڕ مارە ئەبڕرێ ، کە ئەو پارەیان ئـەو زێڕە ئەبێتە مڵکی ژنەکـەو بـەلای مێردەکـە یـەوە ئـەبێ ، وەیان ئـەتوانێ لێی وەر بگرێتەوە •• [ ئەمەش وەکو بۆ پڕ کردنـەوەی کەلەبـەری ئـەو بێ دارایەی ماڵە باوانی بێ کـە وەکو وتمان ئافرەت ناتوانێ لـە سامانی

---

**(١) جۆرێکە لە فرۆشتنەوەی ئافرەت •• لە لایەن مێردەوە نەك لە لایەن ماڵە باوانەوە ••**

ماڵە باوان لەگەل خۆی بەرێ ••• ] جاران ئەم مارەییە ئەندازەیەکی دیاری کراوی کەم بوو ، بەڵام ئیستا شارستانی‌یە بە ناو پێشکەوتووە کانمان خراپ دوو چاری ئەم نەخۆشیە بونو سنوری مارەیی گەلێك بەرز بۆتەوە • بەڵام هێشتا لە لادێکانا لەم روەوە پابەندی نەریتی شەریعەتنو دەستیان لێ بەر نەداوە •• وە ئەمەش وەکو بەهای بارمتەیەك بۆ ئەو ئافرەتە دا ئەنرێ ••

## رەشبەڵەك :

وەکو وتمان ئافرەتی کوردەواری لە ئیشو کاری دەرو دەشتا سەربەستەو لەگەل پیاواندا کار ئەکەن ، بەڵام بەشداری ئاهەنگو کۆڕو کۆبونەوەی خێڵەکیانە ناکەن تەنیا ئەوە نەبێ لە کاتی زەماوەن یان ئاهەنگێکی خۆشی‌دا لە هەڵپەرکێدا تێکەڵ بە پیاوان ئەبنو بەم هەڵپەرکێ تێکەڵاوە ئەڵێن [رەشبەڵەك][1] ••

## سوورانە :

لە سەردەمی دەرەبەگایەتی‌دا ، دەرەبەگەکان گەلێك نەریتی جۆر بەجۆریان بۆ کۆ کردنەوەی دەسکەوتی تایبەتی خۆیان بەسەر جوتیارە ژێردەستەکانیانا سەپاندبوو ، وە لەبەر سوودی خۆیان هەمیشە پشتگیری مانەوەی ئەو نەریتانەیان ئەکردو پشت لە دوای پشت ـ واتا نەوە لە دوای نەوە ـ پەیرەویان ئەکرد •• زوربەی ئەم نەریتانە ئەوەندە باویان پێ پەیدا کردبوو کە بە لای زۆر کەسەوە بوو بوو بە شتێکی ئسایی •• سوورانەش یەکێك بوو لەو نەریتە دروستکراوەی کە تا

---

(١) تەنیا لەبوارە دەرکەوتوەکانا ئەبێ ••

زیانی دەرەبەگایەتی هەبوو لە ناوچەی کوردەواری دا دەستی لە یەخەی لادێ نشینەکانی ژێر دەسەلاتو قەڵەمڕەوی دەرەبەگەکان بەرنەدا •

سوورانە ، سەرانە لێ سەندنێکە کە لە کاتێکدا کچێك شووی بکردایە ئەبوا هەردوو ماڵە باوان لەسەر مەبلەغێك پارە ، یان پارچەیەك چەك ، یان شتێکی بەهاداری بەم چەشنە رێ بکەوتنایەو بە ناوی دیاری‌یەوە لە جیاتی سوورانە بۆ ئاغایان ببردایە •• ئینجا زۆر جار تەماشای ئاستی لێ وەشاوەیی ئەو ئافرەتە ئەکرا کە ئەدرا بە شوو ، ئەگەر ئافرەتەکە شۆخو ناوازە بوایە ئەوا پەلپی سوورانەی گرانی لێ ئەگیرا ، زۆر جاریش لەسەر سوورانەی گران بەها شوو کردنی ئافرەت دوا کەوتووە یان هەڵوەشاوەتەوە ، وەیان هەردوو ماڵە باوان ناچار بوون دەست لەو زەوی‌و زارو شوێن‌و کێڵگەو ئاوو هەواو دیمەنە هەڵ بگرن کە چەن ساڵە لە گەلیانا ئەژین‌و پێی راهاتوون ، بچن بۆ شوێنێکی تر کە تەووژمی دەرەبەگایەتی ئەهوەن تر بێ تیایا •• لە هەمو زەماوەنێکدا تا سوورانەکە وەر نەگیرایەو ئاغا رازی نەکرابایە بووك سوار نەئەکرا ••

## بێوەژن کەوتن :

ئەو ئافرەتانەن کە مێردەکانیان مردوون وە یان تەڵاق دراوون‌و بێ مێرد کەوتوون •• لە کوردەواری دا لە کاتی داخوازی کردنی بێوەژن دا بۆ جاری دوهەم یان زیاتر کە شوو بکاتەوە سەرنجی باری بێوەژن کەوتنەکەی ئەدرێ‌و لە هۆیەکانی ئەکۆڵنەوە ، هەمیشە ئەو بێوەژنانە لە پێش ترن کە مێردەکانیان مردوە تاکو ئەوانەی تەڵاق دراون •• هەروەکو ئەگەر پیاوێك بێ ژن کەوت‌و ویستی ژنێکی تر بخوازێ لە هۆیەکانی بێ ژن کەوتنەکەی ئەکۆڵنەوە ، ئەمانیش دیسان

ئەو جۆرە پیاوانە زۆر تر جێگای باوەڕن لەلای ژنانەوە کە ژنەکانیان مردونو بەو هۆیەوە بێ ژن کەوتون تاکو ئەوانەی ژنەکانیان تەڵاق داوە •• زۆر جار بێوەژنی مێرد مردوو منالی هەیەو بە ئەرکی رەنجی شانو باڵی منالەکانی بەخێو ئەکاو بەسەریانەوە دائەنیشی[1] تا گەورە ئەبن ، بەو کارو فرمانانەی کە ژنەکە ئەیکات ئەڵێن [بێوەژن کۆشی] •• بەڵام ژنی تەڵاق دراو ئەگەر منالیشی هەبێ لێی ئەسەندرێتەوەو منال ئەدرێتەوە بە باوکو دایك لەسۆزو خۆشەویستی منالەکەی دور ئەکەوێتەوە ••

ئینجا ئافرەتی کوردەواری لادێ نشین جگە لەو هەموو باری دواکەوتنی کۆمەڵایەتیو نەخوێندەوارییەی دەوری داوە لەگەل ئەم هەموو بنچینە نالەبارە دوا کەوتوانەدا ئەزیو سەرباری ئەمانەش رۆژ لە دوای رۆژ لە بریتی ئەوەی ئەم بنچینانە هەڵ ئەکێنرێنەوە کەچی لە هەندێك بوارا هەتابێ هەندێکیان زیاتر قایمتر ئەبن •

ئینجا هەتا کو زوربەی ئەم بنچینە کۆنانە باغەی مەسەلەی ئافرەت بن ، ئافرەت ناتوانێ وەکو پێویست جێگای مێژویی خۆی بگرێو شان بە شانی پیاو لە بونیات نانی شارستانێتی دا کار بکاتو ئەو ئەرکە شۆرشگێرییانەی سەرشانی بەجێ بگەیەنێ کە مێژووی گۆڕانی کۆمەڵ خستونەتیە ستۆی ••

---

(۱) واتا شوونا کاتەوە ••

## تێبینی :

وه نەبێ باری ئافرەتی شارستانەکانمان لە هەموو روویەکەوە بە تەواوی پێشکەوتوو بێ ، لە زۆر بواردا ئافرەتی شاریش‌و بگرە خوێندەوارە کانیشیان دوچاری هەمان مەینەتی نەرێتە کۆنەکان‌و پابەندی ریژیمی کۆمەلایەتی دواکەوتوانە بوون .. بەلام ئێمە لەم نامیلکەیەدا بە تەنیا ئەوەندەی توانیمان لە بارەی ئافرەتی لادێ نشینەوە دوایـن چونکە زۆرتر جێگای سەرنجدانن ، بۆیە دەست پێشکەری‌مان لێ کردن .. وە داوا لە خوێنەرە بەرێزەکان ئەکەین ئەگەر شتی زیاتریان بە بیردا هات کە ئێمە پێمان نەزانیبو بیخەنە بەر چاوی خوێنەران‌و سوپاس بۆ ئەوانەی رێزی ئەرکەکەمان ئەگرن‌و هەڵەکانی دەست نیشان ئەکەن ..

**ـ نووسەر ـ**

# لیستەی سەرباسەکان :

×

لەم نامیلکەیە چوار هەزار دانە چاپ کراوە

ژمارەی سپاردنی بە نامەخانەی نیشتمانی
[ ٢٥٧ ساڵی ١٩٧٩ ]

